# دینی ئیبڕاهیمی

## هەوڵێك بۆ ڕوخاندنی عەقیدەی تەوحید



د.إحسان برهان الدين

Ihsanburhan

بسم الله الرحمن الرحیم

دینی ئیبراهیمی نوێ هەوڵێك بۆ ڕوخاندنی عەقیدەی تەوحید

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

## ناسنامەی کتێب

**ناوی پەرتووک: دینی ئیبراهیمی نوێ هەوڵێك بۆ ڕوخاندنی عەقیدەی تەوحید**

**نووسینی: إحسان برهان الدين**

**نـەخـشەسازیی ناوەوە: عبدالله خاکی**

## دینی ئیبراهیمی نوێ هەوڵێک بۆ ڕوخاندنی عەقیدەی تەوحید

دینێکی نوێ بە ناوی دینی ئیبراهیمی بەڕێوەیە، ئیمارات بەڕابەرایەتی کردن وپارە بۆ خەرج کردن و، بە پشتگیری وپیرۆزبایی ئەزهەری لەخشتەچوو و زۆرێك لە بەناو زانای خۆفرۆش و دینفرۆش، کار بۆ بەرپاکردنی و بڵاوکردنەوەی دەکرێت. ئەم دینە هەوڵێکی زۆر دەدرێت بۆ ئەوەی پۆشاکێکی شەرعی لەبەر بکرێت وپاساوی لەشێوەی خۆڵ لەچاوکردن بۆ بهێنرێتەوە.

لەبەر زۆر هۆکار لەوانە جەهلی خەڵکی بە عەقیدەو بیروباوەڕ و بە زانستی شەرعی بەگشتی وزۆریی خەڵکی گومڕا لەژێر ناوی جۆراوجۆردا، کوردستان مەترسی ئەوەی لەسەرە ببێتە گۆڕەپانێکی بەرین و ئاسان بۆ تاقیکردنەوەی ئەو دینە تازەیە، هاوشێوەی دەججال سەرانی ئەم دینە تازەیەش پاساوی عەقڵی و بەهانەی ڕوکەشی و بەڕواڵەت پەسەند و وەرگیراوی بۆ دەهێننەوە.

بۆیە پێویستە و ئەرکێکی پیرۆزە لەسەر ئەوانەی پەرۆشی تەوحید و بیروباوەڕەکەیانن، پەردە لەسەر ئەو گومڕایی و لادانە لە ڕاستە ڕێگای ئیسلام هەڵماڵن و حەقیقەتی ئەو پلانە بۆ خەڵکی ئاشکرا بکەن، نەوەك لە کاتی گەیشتنی ئەو بیرۆکە دژوارە لەگەڵ ئیسلامدا بە کوردستان و بەمیللەتی کورد، خەڵکی پێی هەڵخەڵەتێن و دینەکەیان لەدەست بدەن.

بەداخەوە - لە ئێستادا - میللەتی کورد لەبەردەم ئەو جۆرە بانگەشە و بانگەوازانەدا پاروویەکی ئاسانە بۆ سەرانی ئەو دینە نوێیە وجێگای تەماعی ئەوانە، چونکە کورد بە عاتیفە ئیسلام دەناسێت و شارەزایی لە دینەکەیدا و بەتایبەتی لە بواری عەقیدەو تەوحید و بنەماکانی ئیسلامدا زۆر زۆر کەمە و ئەوانیش جۆرەها ڕێگەی کاریگەرو پلان بۆ دارێژرا دەگرنەبەر بۆ لەخشتەبردنی خەڵکی.

لەلایەکی تریشەوە میللەتی لێوان لێوە لە خەڵکی هەژار و نەدار و چەوساوە بەەستی نەبوونی کە وێڵە بەدوای هەررێگەیەکدا قوتی ماڵ و منداڵەکانی پێ مسۆگەر بکات، ئەوانیش پارەی زۆریان بۆ هەڵڕێژراوە لە پێناو بڵاوکردنەوەی دینەکەیاندا و لەو پێناوەدا خەرجی دەکەن.

جگە لەوەش زۆر بەناو بانگخواز و کەسایەتی ئیسلامی سیاسی خاوەن دیدی ناکۆك لەگەڵ بیروباوەڕی ئیسلامدا هەر خۆیان بیرکردنەوەیان وەکو بیرکردنەوەی سەرانی ئەو دینە تازەیە و کورد واتەنی لە خوایان ئەوێت ئەو دینە بێتە کوردستانەوە بۆ ئەوەی ببنە عەڕاب و چاوساغی گەیاندنی بە کوردی داماو.

بێگومان عەلمانییەکانیش پێشوازییەکی گەرم لەو دینە دەکەن وهەموو کارئاسانییەکی بۆ دەکەن، چونکە دەزانن مەبەست لێی تێکدان و شێواندنی دینی ئیسلامە هەر بەناو ئیسلامیشەوە موسوڵمانان لەڕێگای ڕاست دووردەخاتەوە.

(الأديان الإبراهيمية ) يان ( وحدة الأديان) يان( الديانة العالمية) هەموو ئەمانە زاراوگەلێکن مەبەست لێیان تێکەڵ کردنی حەق و باتڵە بەبەهانەی پێکەوە ژیان و برایەتی مرۆڤایەتی ودرووست کردنی دینێکی یەکگرتوو لە نێوان هەرسێ ئایینەکەدا و هەوڵێکە بۆ یەکگرتنەوەی ئایینەکانی ئیسلام و نەسرانی و جولەکە و دواجار کۆشش وبەرنامەیەکە بۆ کاڵکردنەوەو نەهێشتی سنوورەکانی عەقیدەو تەوحید و ولاء و براء لە ئیسلامدا کە بەو شێوە شێرازەی موسوڵمانان تێکدەچێت و دەشێوێت.

ئەم بانگەشە و دینە نوێیەش، لە ڕاستیدا ڕەگ وڕیشەی کۆنە و هەر زوو جولەکەو نەساراکان داوایان لە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم کرد سازشیان لەگەلدا بکات و هیچ نەبێت بلێت ئێوەش وەکو ئێمە لەسەر حەقن و بیروباوەڕەکەتان تەواوە، بەڵام قورئان قسەی یەکلاکەرەوەی لەو بارەوە کرد و الله تعالى فەرمووی: (وَقَالُوا كُونُوا هُودًا أَوْ نَصَارَى تَهْتَدُوا قُلْ بَلْ مِلَّةَ إِبْرَاهِيمَ حَنِيفًا وَمَا كَانَ مِنَ الْمُشْرِكِينَ)[1]

---

[1] - البقرة/١٣٥.

لەم میانەشدا ئەزهەر و زانایانی دین فرۆش و سەر بە دەسەڵاتە عەلمانی ولیبرالییەکان لە وڵاتانی تر، پشتگیری خۆیان بۆ ئەو دینە تازە دەردەبڕن وکار بۆ سەرخستنی دەکەن، ئەو بەناو زانا دین فرۆشانە بەبێ هیچ شەرمێك نە لە اللە و نە لە موسوڵمانان پشتگیری خۆیان بۆ ئەو دینە درووستکراوە دەردەبڕن و دەستخۆشی لە دەوڵەتی ئیمارات دەکەن.

ئامانج لەم دینە ئەوەیە موسوڵمانان و نەسارا و جولەکەکان بڵێن هەموومان لەسەر حەق و ڕێگای ڕاستین وهەموو ئەم دینانە بەو شێوەی کە ئێستە هەیە ڕاستەو و لەلای اللە وە دابەزیون، وەکو ئەوەی اللە تعالی لە قورئاندا نەیفەرمووبێت: (وَمَنْ يَبْتَغِ غَيْرَ الْإِسْلَامِ دِينًا فَلَنْ يُقْبَلَ مِنْهُ وَهُوَ فِي الْآخِرَةِ مِنَ الْخَاسِرِينَ )[١]. هەروەها سورەتی الکافرون یش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی پێغەمبەری پێشەوا علیه الصلاة والسلام هیچ سازشێکی هەرگیز لەگەڵ گکوفردا نەکردووە و لە عەقیدەی تەوحید بۆ چرکە ساتێکیش دانەبەزیوە.

---

[١] - آل عمران/٨٥

سەرانی ئەم دینە تازە دەڵێن پەرستراو یەکێکە و ڕێگاکان جیاوازن و ئەوەش هیچ کێشەی تێدا نییە!

واتە ئەوان دەڵێن ئەو شەریعەتە گۆڕاوو تێکدراوەی جولەکەو نەساڕاکانیش هەر وەکو شەریعەتی پاك و پاراوی ڕاستی ئیسلام کەسەکان دەگەیەنێتە الله، بەو پێیەش دەبێت موسوڵمان هەموو لادان و گومڕاییەکانی ئەوان بەباش و بێ کێشە بزانێت، کە ئەوەش کوفرێکی ڕاشکاوانە ودیارە موسوڵمان لە بازنەیەی دینەکەی دەردەکات.

لە ڕاستیدا ئەم بانگەشەیە - وەکو شێخ بکر أبو زید دەڵێت - کۆمەڵە ئامانجێکی فەلسەفی و سیاسی و ئیلحادی لە پشتەوەیە، جۆرێکیشە لە تۆڵەکردنەوەی ئەوان لە ئیسلام و موسوڵمانان، چونکە کۆمەڵە ئامانجێکی زۆر ترسناکیان هەیە کاری بۆ دەکەن، لەوانە:

١- درووستکردنی قۆناغێك لەسەر لێشێواندنی موسوڵمانان لە ڕێگەی بڵاوکردنەوەی گومان وحەزو ئارەزوو، کە دوااجر ئەوشە دەبێتە مایەی درووستبوونی موسوڵمانی ڕاڕا و بێ یەقین.

٢- سنووردارکردنی بەرفراوان بوونی کاری ئیسلامی و بچووك کردنەوەی ودرووست کردنی بەربەست لەبەردەم بانگەوازی ئیسلامدا.

٣- هەوڵێکە بۆ لاوازکردنی ئیمان و بیروباوەڕ لە لای موسوڵمانان و بنەبڕکردنی بانگەوازی تەوحید کە بنچینەی مانەوەی ئیسلام و موسوڵمانانە.

٤- ڕێگە گرتن لەوەی کەس بوێرێت جولەکە و نەساڕا تەکفیر بکات، بەڵکو وەکو برای ئایینی تەماشا بکرێن وبەوشێوەش موسوڵمانان بێ ئەوەی بەخۆیان بزانن بەشیکی زۆر لە ئایەتەکانی قورئان لەو بارەوە ڕەتدەکەنەوە ونکۆڵی لێ دەکەن.

٥- لە ڕێگەی بانگەشەی یەکگرتنی ئایینەکان، کۆشش دەکرێت گۆڕانکاری گەورە لە شێوازی بیرکردنەوەی موسوڵماناندا بدرووست کرێت بە شێوازێك بێ ئەوەی بەخۆیان بزانن ببنە دەژمنی دینەکەی خۆیان، لەڕێگەی کارنەکردن بەشەریعەت و گوێنەدان و بە سنوورەکانی عەقیدە.

٦- هەوڵێکە بۆ لاوازکردن و بێ هەیبەت کردنی ئیسلام بە شێوەیەك کە ببێتە دینیك هاوشێوەی هەر دینێکی تری دەستکردی مرۆڤەکان و وەسەنی و جیاوازی نەبێت لەگەڵیاندا.

٧- ڕێخۆشکەری بۆ بڵاوبوونەوەی ئایینی نەساڕاو جولەکە دەکات لەناو موسوڵماناندا و کار دەکات بۆ کپ کردنەوەی هەر کاردانەوەو غیرەتێکی موسوڵمانان لەسەر عەقیدەو دینەکەیان.

٨- بەدیهێنانی ئامانجی هەرە گەورەش کە بریتییە لە زاڵبوونی یەهود و نەساڕا و مارکسییەکان بەسەر هەموو جیهاندا و جیهانی ئیسلامی بەتایبەتی و بەتایبەتتریش دەستگرتن بەسەر دوورگەی عەرەبدا کە کەعبەو شوێنە پیرۆزەکان و قەبری پێغەمبەرﷺ لەخۆ دەگرێت وسەرەتاکانی ئەوەش بەداخەوە درووست بووە، ئەویش لە ڕێگەی داگیرکارییەکی فیکری و ڕۆشنبیری و ئابووری و سیاسی و بەرپاکردنی بازاڕێکی هاوبەش کە شەریعەتی ئیسلام بەهیچ شێوەیەك دەسەڵاتی بەسەریدا نەبێت، بەو شێوەش هەموو خراپەکانی وەکو سوو و داوێن پیسی و بێ ڕەوشتی بە هەموو ڕەهەندەکانییەوە تەشەنە دەکات.

بەبێ هیچ گومانێك شەریعەتی ئیسلام کۆتا ڕێبازو شەریعەتە بۆ مرۆڤایەتی و الله تعالی بەهیچ ڕێگاو ڕێبازێکی تر جگە لە ئیسلام ڕازی نابێت، بۆیە پێویستە هەموو ئەوانەش خۆیان بە یهودی و بە نەسرانی دەزانن ببنە موسوڵمان وبێنە سەر دینی حەق.

هەروەها پێویستە و واجبە لەسەر هەموو موسوڵمانێك لە دڵەوەو بە زمانی و بەهەموو توانایەکی لەدژی ئەو دینە نوێیە بوەستێتەوە و ماڵ و مناڵ و کەس وکار و دەوروبەری لەو شەڕو خراپەیە بپارێزێت و نەلێت پەیوەندی بە منەوە نییە، چونکە نکۆڵی کردن و ڕووبەڕووبوونەوە بەبەڵگە و بەیان وبانگەواز وڕوونکردنەوە لەگەڵ ئەو ئایینە تازەیەدا، فەرزێکی عەینییە لەسەر هەموو موسوڵمانێك، لەبەر ئەوەی کە ئەو بانگەشەیە کە ئاینی ئیسلامی وەکو عەقیدەت و شەریعەت کردووەتە ئامانج.

إحسان برهان الدين
٢٩ شعبان ١٤٤٤
٢١-٣-٢٠٢٣